# بۆچی تێگەیشتن و بیرکردنەوە لە خودی زانست گرنگە؟

نووسینی: جەیمس لەیدمان
ئامادەکردن و وەرگێڕان: محەمەد عوسمان

لە چەندین ڕوووەوە، سەردەمی ئێمە هاوشێوەی سەردەمەکانی پێشووە و جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، بۆ نموونە؛ زۆرینەی خەڵک تەنها بۆ ئەوە کار دەکەن بژین، هەندێک خەڵکی کەمیش لە چینێکی خۆشگوزەران و خانەدانن، چەندین کەسیش لە ململانێ و جەنگەکاندا لەناو دەچن. ئێمە و باوباپیرانمان لە هەندێک پرۆسەی سروشتیدا هاوبەشین، وەک سووڕی لەدایکبوون، نەوەخستنەوە و مردنیش. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا چەندین سیمای هاوچەرخ هەیە کە تەواو نوێن، بۆ نموونە کەسێک دەتوانێت پەیوەندی بە کەسێکی دیکەوە بکات لەوپەڕی جیهانەوە، بە بینینی وێنەیەکی زەوی لە بۆشایی ئاسمانەوە کەسێک بۆی دەردەکەوێت کە زەوی شێوەیەکی تۆپی هەیە. لە تواناددا نییە ژیانی ڕۆژانەی هەندێک خەڵک بەبێ کۆمپیوتەر، تەلەفزیۆن و ئامێری ئەلیکترۆنی وێنا بکرێت. زانستی پزیشکی چارەی چەندین نەخۆشی کردووە کە بووەتە هۆی مردنی چەندەها کەس لە سەردەمەکانی پێشووتردا. لەبەرانبەریشدا، بە دیوە نەرێنییەکەیدا، چەکی ئەتۆمیمان هەیە و هەندێک وڵات خاوەنینی و دەتوانن ژیانی نیوەی هەسارەی زەوی لەناو ببەن. ژینگە و کەشوهەوای دەوروبەریش بەهۆی تەنۆڵکەگەلێکەوە پیسبوون کە خودی مرۆڤ دەبنە هۆکاری دروستکردنیان لە کارگەکاندا.

کاریگەرییەکانیان باش بن یاخود خراپ، هیچ یەکێک لەم تەکنەلۆژیایانە بەبێ زانست دروست نەدەبوون. ئێمە پێویستمان بە هیچ تیۆرییەکی زانستی نییە تاوەکو گاجووت، چەقۆ، تایە و پلاستەر دروست بکەین، بەڵام هەرگیز بەبێ ئەو تیۆریا و میتۆدە زانستییانەی کە لە دووسەد ساڵی ڕابردوودا پەرەیان پێدرا، هیچ ئامێرێکی ئەلکترۆنی، کەشتی ئاسمانی، نەشتەرگەری ورد و چەکی کۆمەڵکوژی نەدەتوانرا دروست بکرێت. بەرهەمی زانست و تەکنۆلۆژیا کاریگەرییەکی گەورەیان هەیە لەسەر ڕێڕەوی ژیانمان و هەروەها چۆنیەتی دەستکاریکردنی ژینگەی دەوروبەرمان، ئەگەر گومانیشت لەمە هەیە، وێنای ئەوە بکە ڕۆژێک بەبێ بەکارهێنانی هیچ ئامێرێکی ئەلکترۆنی و یاخود هیچ کەرەستەیەک کە ماددەی پلاستیکی تێدا بێت، ژیان ببەرەسەر. هەمووان بە بەراورد بە کایەکانی دیکەی مەعریفە بە گرنییەوە لە پێگەی زانست دەڕوانن، تەنانەت هاوڕاشن لەسەر ئەوەی گرنگە پارە خەرج بکەن بۆ ئەوەی لە زانستی مۆدێرن تێبگەن، لەهەمان کاتیشدا کەسانێک هەن هەر لە ڕوانگەی ئەم گرنگێتییەی زانستی مۆدێرنەوە ئەدەب و هونەری مۆدێرن دەکەنە جێگەی گاڵتەپێکردن. گەر دوورتر بڕۆین، دەبینین خەڵکی لە ئێستەدا زۆر زیاتر متمانە بە لێدوانی زانایەک دەکەن وەک لەوەی متمانە بە لێدوانی ڕۆژنامەوانێک، پارێزەرێک یاخود سیاسەتمەدارێک بکەن. ڕاست بێت یاخود هەڵە، زانست وەک عەقڵانیترین(Ultimate Rational) و بابەتیترین(Ultimate Objective) کایەی مەعریفی دادەنرێت کە بتوانێت وەڵامدەرەوەی پرسیارەکانمان بێت. زاناش هەمیشە وای لێ پێشبینی دەکرێت، کە کەسێک بێت داتا کۆبکاتەوە و



لیکدانەوەیان بۆ بکات و بگاتە دەرەنجامێک کە «زانستییانە سەلماندوێتی»، نەوەک هەر لەخۆوە و لە بیروڕای خۆیەوە قسە بکات. دادگا کەسێک دەسگیر ناکات لەسەر قسەی مەلا یاخود ڕۆماننوسێک، بەڵکو بە شێوەیەکی فراوان پشت دەبەستێت بە بەڵگەی کۆمەڵە پسپۆڕێک، کە زانان لە چەند کایەیەکی جیاوازی زانستیدا؛ ئەگەر پسپۆپڕێک لە بواری بۆڵیستیکدا (زانستێکی میکانیکییە، لە هەڵدان، فڕین و ڕەفتاری گوللە، بۆمب و موشەکەکان دەکۆڵێتەوە) ڕایگەیاند گوللەیەک لە فڵان ئاڕاستەوە هاتووە، یاخود پاسۆلۆجیستێک (پسپۆڕی نەخۆشییەکان) ڕایگەیاند فڵانە کەس پێش مردنی دەرمانێک لە جەستەییدا هەبووە، ئەوا ئەم قسانە وەک فاکتی ڕووداوەکە و هەقیقەتێک مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. هەمووومان کاتێک تووشی نەخۆشییەک دەبین دەچینە لای دکتۆرێک، بۆ ئەوەی کۆمەڵێک دەرمانمان بۆ بنووسێت و بەکاری بهێنین. ئێمە بەرمەبنای ئەوەی ئەم دەرمانانە چاکمان دەکەنەوە و کاریگەری خراپیان نابێت لەسەرمان بەکاریان دەهێنین. زۆربەی کات زانستی پزیشکی مۆدێرن وەک کایەیەکی «بە-بەڵگە-سەلمێنراو» و زانستی مامەڵەی لەگەڵ دەکەین. بەهەمان شێوەش ئەگەر زانایاک، کە لای حوکمەتەوە پشتی پێ بەسترابێت، ئەگەر لێدوانی دا کە فڵان خواردنی دیاریکراو یاخود ماددەی کیمیایی دیاریکراو مەترسیدارە و جێی متمانە نییە، ئەوا بەکارهێنان و کڕینی قەدەغە دەکرێت.

ئەو نمونانەی سەرەوە کە پەیوەندییان بە دادگەری، تەندروستی و سەیفتی و چەندین بابەتی دیکەوە هەیە، هەندێک جار شۆڕ دەبنەوە بۆ کارەکانی ڕۆژانەی ئێمە هەر لە ئەندازیاری و بیناسازییەوە تاوەکو ماسیگرتن و جوتیارییش. لەگەڵ ئەوەشدا، مرۆڤی مۆدێرن لە زۆربەی کایەکانی ژیانی ڕۆژانەیدا، دەیەوێت یاخود ناڕاستەوخۆ پشت دەبەستێت بە بۆچوون و بەڵگەی زاناکان پێش هەڵنانی هەر هەنگاوێکی گرنگ. کەواتە ئێمە وەک هەر تاکێکی دیکەی ئەم سەردەمە مۆدێرنە، لەو خاڵەدا هاوبەشین کە متمانە بە زانست و زاناکان دەکەین، لەگەڵ ئەوەشدا ژیانی ڕۆژانەمان تەواو کاریگەرە بەزانست.

لەلایەکی دیکەوە، بیرکردنەوە و پرسیارکردن لەسەر توخمە سەرەکییەکانی خودی زانست، لەنێو سکوڵ و بەشە زانستییەکاندا گرنگییەکی ئێجگار گەورەی هەیە. لەبری ئەوەی تەنها زانست بەکاربهێنریت، تێگەیشتن لە خودی زانست و میتۆدی زانستی و دیاریکردنی سنووری زانست دەبێتە مەرجی سەرەکی بوون بە توێژەر، زانا و تێگەیشتوو لە سروشت و دەوروبەر. ئەمەش هۆکارێکی گرنگە کە وەڵامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە؛ بۆچی تێگەیشتن و بیرکردنەوە لە زانست گرنگە؟

سەرچاوە:

James Ladyman, Understanding Philosophy of science.

بۆ پەیوەندیکردن:
Hame8290@gmail.com

# میتافیزیک لە زانستدا چی دەگەیەنێت؟

نووسینی: حوسەین عەلی
ئامادەکردن و وەرگێڕان: محەمەد عوسمان

کاتێک باس لە میتافیزیک دەکەین لێرەدا، ئاماژە بۆ سێ لایەنی جیاوازی مێتافیزیکی زانست دەکەین، کە دەتوانین لەم سیانەی خوارەوە جێگەیان بکەینەوە:

١- سۆسەکردنی تێڕامانی (حدس التأملي – Speculative Conjectures) [بیروباوەڕێک کە هێشتا بەڵگەیەک پاڵپشتی نەکات]

٢- پێشگریمانە بنچینەییەکان (الفروض الاساسية المسبقة – Basic Presuppositions)

٣- بیروباوەڕە عیرفانییەکان (الاعتقادات الصوفية – Mystical Beliefs)

لەگەڵ ئەوەشدا گرنگە ئەوە بڵێین ناتوانین جیاکارییەکی تەواو لەنیوان ئەم سێ لایەنەدا بکەین، چونکە دەکرێت سۆسەکردنە تێرامانییەکان ببنە تیۆریای ئەزموونکراوی زانستی، بەو شێوە دەکرێت وەک پێشگریمانەکردنێکی بنچینەیی دابنێین، لە تیۆریایەکی زانستیدا. بەهەمان شیوەش ئەگەر بیروباوەڕێکی سۆفییانە ڕەت بکەینەوە بەهۆی ئەوەی هیچ واتایەک لەخۆیان هەڵناگرن لە دەرەوەی ئێمە، بەڵام دەتوانین وەک پێشگریمانەی بنچینەیی وەریان بگرین. لە سەروو هەموو ئەمانەشەوە ئەم جیاکارییە، گرنگە بۆ ئەوەی بتوانین پێگەی هەریەکەیان دیاری بکەین لە تیۆریا میتافیزیکییەکاندا.

(١) دەتوانین سۆسەکردنی تێڕامانی، شێواز یاخود بەرگە پۆپەرییەکەی (The Popperian Aspect) بکەین بەبەردا. فەیلەسووفی نەمساوی، کاڕل پۆپەر Karl Popper (١٩٠٢-١٩٩٤ز) وای دەبینێت، ئەو سۆسەکردنانەی پەیوەندییان بە جیهانی دەرەکییەوە هەیە، کاتێک لە توانادا نەبێت بنەمای «توانای پوچەڵکاری – Falsifiability»ی بەسەردا جێبەجێ بکەین، دەبێتە تیۆریایەکی مێتافیزیکی. لەهەمان کاتدا ئەم بنەمایە پێوەرێکمان پێشکەش دەکات، تا بتوانین لە ڕێیەوە بابەتە زانستی و نا زانستییەکان لەیەکدی جیابکەینەوە، بەو واتایەی ئەو بابەتانەی ئەم بنەمایەیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، زانستین. ئەوانەشی بەسەریاندا جێبەجێ نەکرێت نازانستی و مێتافیزیکین، بەبێ ئەوەی ئاماژە بکات بەوەی مانا هەڵناگرن. بەو مانایەی دەکرێت سۆسەکردن و گریمانەکردنێکی ڕاست بن. بۆ نموونە تیۆریای گەردیلەیی دیمۆکریتس Democritus (٣٧٠پ.ز.-٤٦٠پ.ز.) کە دەڵێت ماددە لە بەشی زۆر بچووک پێک هاتوون کە ناکرێت لەوە بچووکتر بکەینەوە، دەتوانین وەک سۆسەکردنێکی پۆپەری لێی بڕوانین. بەو پێیەی لەڕێی ئەزموونکردن (Observe)ـەوە ناتوانین بەم ڕاستییە بگەین، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستییەکی جیهانی فیزیکی سروشتن. چەندین نموونەی دیکەش دەتوانین بدۆزینەوە لە مێژوودا: بۆ نموونە سۆسەکردنەکەی کۆپەرنیکۆس Copernicus (١٤٧٣ز-١٥٤٣ز) کە باس لە فراوانبوونی گەردوون دەکات، هەروەها تیۆریاکەی نیوتن Isaac Newton (١٦٤٣ز-١٧٢٧ز) دەربارەی قسوری زاتی کە باس لەوە دەکات گۆڕان لە جوڵە، پێویستی بە هێزێک هەیە هەمان بڕی هەبێت. تیۆریاکەی یەکەم چیتر مێتافیزیکی نییە، بەو پێیەی ئەزموونکردنی سەلماندوویێتی، تیۆریای دووەمیش توانای زانینی هەیە بەو پێیەی بنەمایەکی میتۆدییە، لەگەڵ ئەوەشدا پێشگریمانەیەکی بنچینەیی فیزیکی کلاسیکە.

(٢) ئەمە دەمانگەیەنێتە لایەنی دووەمی میتافیزیک، ئەویش پێشگریمانە بنچینەییەکانە کە پەیوەندییان بە سروشتی جیهانەوە هەیە. هەندێک لەم پێشگریمانانە بنچینەییەکەیان بە شێوەیەکە کە هەرگیز گومانیان لێ ناکەین، بۆ نموونە بوونی شتەکان لە دەرەوەی ئێمە، هەروەها بوونی پەیوەندییەکی هۆکاربەندی (علل و معلول) نێوان ڕووداوەکان. ئەمەش هەمان بابەتە کە بێرتراند ڕاسڵ ناویان لێ دەنێت «بیروباوەڕە غەریزییەکان – Instinctive Beliefs». لەگەڵ ئەوەشدا هەموو پێشگریمانە بنچینەییەکان غەریزی نین بۆ نموونە یاسای یەکەمی نیوتن «Law of Interia» کە باس لە مانەوەی تەنەکان دەکات لە دۆخی خۆیان ئەگەر هێزێک یاخود شتێک کاریان تێ نەکات. ئەوەشی پەیوەندی بە هۆکاربەندییەوە هەیە، دەبینین فەیلەسووفانی زانستی نوێ بە یەکێک بە سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەی زانستی دادەنێن، ئەگەرچی ڕاستێتییەکەی لە ئەزموونکردنەوە دەرنەکەوێت، ئەوەتا ماکس پلانک دەڵێت: یاسای هۆکاربەندی تەنها پێشگریمانەیەکە، بەڵام پێشگریمانەیەکی بنچینەیی کە بە بنچینەی گشت گریمانە زانستییەکان دادەنرێت. ئاینشتاینیش لە نامەیەکیدا بۆ بۆرن دەنووسێت: ئێمە هەمیشە بە هەندێک پێشگریمانەی بنچینەیی دەست پێ دەکەین، تەنانەت لە توێژینەوەی زانستییشدا، لەوانە؛ هۆکاربەندی – Principle of Reason، بابەتیبوون – Objectivity و سادەیی یاساکان – Principle of Simplicity.

کەواتە پێشگریمانە بنچینەییەکان، گرنگن بۆ ئەوەی چوارچێوەیەکمان پێ ببەخشن، تا لەم چوارچێوەیەدا ئەزموونە هەستەکییەکانمان ڕاڤە بکەین، جگە لەوەش ڕێگەمان دەدەن وەسفێکی واقیعی جیهانی دەرەکیمان بکەین. مادام تیۆریاکان پێش ڕووداوەکان دەکەون، لەبەر ئەوە گرنگن بۆ زانینی ئەوەی ڕووداوەکان تەنها پێدراوێک نین لە ڕێگەی هەستەکانەوە بە ئێمە بگەن. بەڵکو دەرکەوتنی ڕووداوەکان بەهۆی پەیوەندیکردنی بیرکردنەوەمان دروست دەبن لەگەڵ شتەکانی جیهانی دەرەوەماندا. گومانی تێدا نییە ئێمە ناچارین پشت بە چەند پێشگریمانەیەک ببەستین بۆ بونیادنانی ڕووداوی ئەزموونکراو، تا بتوانین ڕاڤەی جیهانی دەوروبەرمان بکەین لەڕێی ڕووداو و شتەکانەوە.

(٣) سێهەم لایەنی میتافیزیکی، بیروباوەڕە عیرفانییەکانە. ئەوانەی ئاماژە بۆ وەسفێکی فیزیکی ناکەن، بەڵکو بانگەشەی ئاشکراکردنی ڕاستییەک دەکەن کە سەروو ئەزموونکردنی هەستەکی مرۆڤە، وەک بوونی ئامانجێکی لە بەدیهێنانی گەردوون، یاخود ئەوەی جیهان سێبەری جیهانێکی دیکەی ڕەهایە، یاخود بوونی ژیانێکی دیکە لەدوای مردن، ڕوودانی ڕووداوەکانی جیهان بەپێی قەزا و قەدەر یاخود مرۆڤەکان سەربەستن لە گرتنەبەری ڕێگە ژیانیان. بیروباوەڕی ئایینەکان لەبارەی بوونی خودا نموونەی ئەم بیروبۆچوونە میتافیزیکییەن. ئەم لایەنەی میتافیزیکە بەوە ئەژمارکراوە کە دەگاتە ڕاستییە باڵاو بەرزەکان، بەتایبەتیش هەمان لایەنە کە تۆمەتبار کراوە لەلایەن پۆزیتیڤیست و پۆزیتیڤیستە لۆجیکییەکانەوە. دەیڤد هیوم پێش دوو سەدە ئەم بیروباوەڕانەی ڕەت کردعتەوە، وەک دەڵێت: ئەم بیروباوەڕانە دەخەمە دۆزەخەوە، تەنها سەفەسفەتە و وەهمن. ئاشکراشە ئەم ڕوانینە لێکدژە ناکرێت هەردووکیان بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە ڕاست و دروست بن. لێڕەشەوە ئێمە لەم هەڵوێستەدا؛ یان دەبێت دەستبەرداری بیرکردنەوەی ڕێکخراوی لێکدژ بین، یان ڕووبەڕووی ئەم پرسیار ببینەوە؛ ئایا کام لەم دوو تێڕوانینە بە تەواوەتی ڕاستە؟ گەر یەکێکیان بێت، کامیانە؟

سەرچاوە:

حسين علی، الاسس الميتافيزيقية للعلم، دار قباء للطباعة و النشر والتوزيع (قاهرة)، ٢٠٠٣.

# زانست و فەلسەفە

•• تیراژی ٥٠ دانە •

بڵاوکراوەیەکی بچووکی فەلسەفی و زانستییە، چەند خوێندکارێک بەپێی توانا بڵاوی دەکەنەوە.




**پرسیار منداڵدانی بیرکردنەوەیە.**

(مارتن هایدگەر)


ژمارە سفر: ٢٠١٧/٥/٢١


زانستی ئەزموونی وەک کایەیەکی مەعریفی گرنگ و کاریگەری نێو کۆمەڵگە، جێکەوتی گەورەی هەیە لەسەر چەندین ڕەهەندی ژیان، ئیدی چ لایەنی کۆمەڵایەتی چ سیاسی چ پیشەیی بێت. بەڵام ئەوەی گرنگترە سەرنجی بخرێتە سەر، ئەو کاریگەرییەیە کە زانست بەسەر هزر و بیرکردنەوەوە هەیەتی. چونکە گومانی تێدا نییە هەر ئەم ڕەهەند هزرییەیە کە لایەنەکانی پێشووش دروست دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هزر تایبەتمەندییەکی مرۆڤە. لێرەدا بۆ ئەوەی لەم کاریگەرییە تێبگەین، دەبێت بزانین زانست خۆی چییە؟ چۆن لە زانست بکۆڵینەوە؟ چ شتێکیش لێکۆڵینەوە و تێگەیشتن لە خودی زانست پێویست دەکەن؟ ئێمە پێمان وایە زانکۆ بە گشتی و فاکەڵتییە زانستییەکانیشی بەتایبەتی پێش هەر شوێنەگەیەی تر، لەسەر ئەندامانی پێویستە گفتوگۆ و دیالۆگ لەسەر زانست سەرپێ بخەن. بەرمەبنای ئەم پێویستییەشە، ئێمە لەمەودوا بەپێی توانا هەوڵ دەدەین دەرگا لەسەر بابەتەکان بکەینەوە و بیانوروژێنین.

# فەلسەفەی زانست چییە؟ گرنگییەکەی چییە؟

نووسینی: ژیار فەزڵەددین

ڕۆژانە کۆمەڵە بابەتێکمان بەر گوێ دەکەوێت کە پەیوەندی بە زانست و نا زانستەوە هەیە، لە چارەسەرکردنی کۆمەڵە نەخۆشییەک بە کەرەستەگەلێکی ئایینیەوە تا بابەتی جنۆکە و ڕۆح و جوڵاندنی تەنەکان بە هێزی عەقڵی و فەلەکناسی (علم التنجیم – Astrology) و بورجەکان و جادوو و فاڵچێتیش. لێرە پرسیاری ئەوە خەیاڵدانمان داگیر دەکات؛ ئایا بە چیدا بابەتگەلێکی لەم شێوە جیابکەینەوە: ئاخۆ زانستین یاخود نازانستین؟ ئایا دەکرێت لە مەودای زانستدا جێیان ببێتەوە؟ ئایا هیچ پێوەرێک یاخود کۆمەڵە پیوەرێکمان هەیە بۆ جیاکاری لەنێوان «زانست» و «نازانست»دا؟

زانست وەک کایەیەکی گرنگی مەعریفە و زانین خاوەنی کۆمەڵێک سیفاتی تایبەتە کە جیایدەکاتەوە لە کایەکانی دیکە. بەرمەبنای ئەم سیفاتانەش کۆمەڵێک پێوەر و مێتۆد دادەنرێت بۆ جیاکردنەوەی بابەتە زانستییەکان لە بابەتە نازانستییەکان. ئەم پێوەرانەش لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە گۆڕینیان بەسەردا هاتووە بەهۆی گۆڕانی تێڕوانینی ئەو سەردمە بۆ بابەتی مەعریفە، کە بووەتە هۆی گۆڕانێک لە تێگەیشتنی مرۆڤەکان بەرامبەر چەمکی زانست و چییەتی زانست، دەرەنجامی ئەم گۆڕاکارییەش میتۆدی نوێ داڕێژراوەتەوە بۆ زانست. هەر بە نموونە لای هەندێک لە فەیلەسووفەکان کە بە پۆزیتیڤیستەکان ناسرابوون، مێتۆدی زانستی لەسەر بنەمای پشت ڕاستکردنەوە «Confirmation» دامەزرابوو، کە تیایدا تیۆرێک تا چەند پشتڕاستکەرەوەی زیاتری هەبووایە هێند زیاتر زانستی بوو، بە نموونەی ئەوەی تا چەند تۆ بڕی کانزا گەیەنەرە تاقیکراوەکانت زیاتر بێت هێندە زیاتر ڕاستی وتەی «هەموو کانزاکان کارەبا دەگەیەنن»ت بۆ پشتڕاست دەبێتەوە. بەڵام لای فەیلەسووفی نەمساوی کارڵ پۆپەر (١٩٠٢–١٩٩٤) ئەم کردارە پێچەوانە دەبێتەوە و بەلای پۆپەرەوە کاری زانست ئەوەیە تا دێت زیاتر لە ڕاستی شتەکان نزیک ببێتەوە نەوەک ئەوەی کە تا ئێستا دەزانرێت پشتڕاستبکرێنەوە، بەڵکو خودی ئەو شتانە جارێکی دی بخرێنەوە ژێر پرسیار لەپێناو ئەوەی کە دەرکەون تا چەندە ڕاستن و مەودای بابەتەکانی کە لێکدانەوەی بۆ دەکەن زیاد بکات.

واتا ئامانجی زانست لای پۆپەر ئەوەیە کە زیاتر لە سروشتی ڕاستەقینەی واقیع نزیکمان دەکاتەوە، هەڵبەت ئەم کارەش بە پشتڕاستکارییەکەی پۆستیتیڤیستەکان ناکرێت چونکە ئەوان هەردەم خەریکی سەلماندنی تیۆرەکانن نەوەک بیانخەنە ژێر پرسیارەوە، بۆیە لای پۆپەر دەبێت زانست لەسەر بنەمای پووچەڵکاری «Falsification» کار بکات، واتا هەرچی تیۆرێک توانای ئەوەی لەخۆگرت کە تاقیبکرێتەوە و پووچەڵ بکرێتەوە ئەوا تیۆرێکی زانستییە. بۆ نموونە کاری زانا ئەوە نییە بڕوات بەدوای قازی سپیدا بگەڕێت بۆ پشتڕاستکردنەوەی وتەی «هەموو قازەکان سپین»، چونکە خودی ئەو پرۆسەیە هەرگیز نامانگەیەنێتە زانیارییەکی نوێ دەربارەی جیهان، هەرگیز ناشکرێت بە تەواوەتی بسەلمێنرێت کە ئاخۆ وایە یاخود نا. بەڵکو کاری زانا ئەوەیە بەدوای قازی ڕەشدا بگەڕێت، چونکە کاتێک قازێکی ڕەش دەدۆزێتەوە بۆی دەردەکەوێت کە ئەو وتەیە لە بنچینەدا هەڵە بووە و بەدوای تیۆرێکی جێگرەوەی باشتر دەگەڕێت کە بتوانێت ئەم دیاردەیەش شرۆڤە بکاتەوە و ئەم تیۆرە نوێیەش لەوی پێشوو نزیکتر دەبێت لە واقیعەوە چونکە توانای شرۆڤەی کۆمەڵە دیاردەیەکی زیاتری هەیە کە تیۆری پێشوو نەیدەتوانی شرۆڤەیان بکاتەوە. ئەمەش مەیدانی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی زانستە، واتا لێکۆڵینەوە لە خودی واتای چەمکی زانست و مێتۆدی زانستی و ئەو سنوور و مەیدانانەی کە تیایدا زانست کاردەکات، واتا بە پشتبەستنمان بە پێناسە و مێتۆدەکانی کە لە فەلسەفەی زانستدا کاریان لەسەر کراوە دەتوانین بابەتە زانستییەکان جیاکەینەوە لە بابەتە نازانستییەکان. بۆ نموونە بابەتێکی وەک فەلەکناسی، بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە ڕۆژێکی دیاریکراودا کەسێک کە خاوەنی بورجێکی دیاریکراوە تووشی ڕووداوێکی دڵخۆشکەر دەبێت، ئەم بانگەشەیە بانگەشەیەکە ناتوانین بنەمای پوچەڵکاری بەسەردا جێبەجێ بکەین بەپێی تیۆرەکەی پۆپەر، چونکە ئێمە هیچ هۆکارێکمان نییە بۆ تاقیکردنەوە و پێوانەی ئەوەی کە هەواڵە دڵخۆشکەرەکە بەهۆی ئەو بوورجە دیاریکراوەوە بووە. یان کاتێک بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە ڕۆح هەبوویەکی ناماددییە، بێ مانایە کە زانستێکی ئەزموونگەرایی بتوانێت لەم بابەتە بکۆڵێتەوە و بزانێت وایە یاخود نا، لەهەمان کاتیشدا خودی مێتۆدە زانستییەکان ڕێگرن لە لێکۆڵینەوە لە بابەتێکی لەو شێوەیە. هەروەها پەیوەندی نێوان هۆکار و بەرئەنجامی کە دەدرێت بەدەستەوە لەم کایانەدا ناڕوونە و ناتوانرێت بزانرێت کە ئەوە هۆکارەکە بووە یاخود نا، بە نموونە: کاتێک کەسێک «چاو» لە کەسێکی دیکە دەکات و دواتر ئەم کەسەی دیکە ڕووداوێکی بەسەردا دێت، شتێکی نادیارە کە ئایا ئەم شتەی دی بەهۆی خودی چاوەکەوە بووە یاخود تەنها شتێکی ئاسایی بووە و ڕووی داوە وەک هەرشتێکی ڕۆژانەی دیکە، واتا کە مرۆڤەکان بە ئاسایی هەموو ڕۆژێک تووشی چەندەها حاڵەتی ناخۆش دەبن، کاتێک کە ڕۆژێک کەسێک چاویان لێ دەکات، ڕۆژی دواتر دووبارە وەک هەموو ڕۆژێک شتێکی خراپیان لێ بەسەردێت، هیچ هۆکارێک نییە کە وامان لێبکات بڵێین کە ئەو شتەی بە ئاسایی ڕوودەدات ئەمجارە هۆکاری چاوەکەیە لەکاتێکدا کە بە ئاسایی خۆی ڕوو دەدات و تۆ هیچ شتێکت لەبەردەسدا نییە تا بزانیت ئاخۆ بەهۆی چا و لێکر د نە کە و ە ڕوویداوە یاخود نا، هەروەها ئەو پرسیارە دێتە پێش کە ئایا هەر دوو شتێک بەدوای یەکدا هاتن، ئەوا مەرجە هەمیشە یەکەم هۆکاری دووەم بێت؟ یاخود مەرج نییە هەر دوو ڕووداوێک بەدوای یەکدا بێن یەکەم هۆکاری دووەم بێت؟



کاریکاتێرێکی کارڵ پۆپەر – Karl Popper

پرسی لێکۆڵینەوە لە باشترین مێتۆدی زانین بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی سروشت پرسێکی کۆنە و هەوڵی زۆر لەلایەن فەیلەسووفانەوە دراوە لەپێناو گەیشتن بە مێتۆدێک لەو بارەوە. یەکێک لەو فەیلەسووفانەی زۆر بەوردی کاری لەم بابەتە کردبێتی ڕێنێ دیکارت (١٥٩٦ز–١٦٥٠ز) ی فەڕەنسییە. دیکارت لە پرسی گەڕان بەدوای گونجاوترین و دروستترین مێتۆد بۆ لێکۆڵینەوە لەبارەی سروشتەوە، هەموو مێتۆدەکانی پێش خۆی دەخاتە ژێر پرسیارەوە و هەوڵی ئەوە دەدات بزانێت تا چەند ئەو زانیاریانەی بەرئەنجامی ئەم مێتۆدانە دەستکەوتوون، زانیارییەکی ڕاست و دروست و جێ متمانە بوون. ئەم پرسەش پرسی کایەی ئیپیستمۆلۆژیا (Epistemology) و تیۆری هەقیقەتە (Theory of Truth) کە لە بابەتی پەیوەندی نێوان سروشت و زانین دەکۆڵێتەوە؛ بەواتایەکی تر دەربارەی ڕادەی ڕاستێتی زانینەکانی مرۆڤە لەبارەی سروشت و گەڕان بەدوای باشترین مێتۆدە، تا لە ڕێیەوە لە سروشت بکۆڵێتەوە و زانیاری لەسەری هەبێت. ئەمەش سەرەکیترین پرسە کە کایەی ئیپستیمۆلۆژیا لێی دەکۆڵێتەوە. هەڵبەت هەموو مێتۆدێکی زانستی کە دەکۆڵێتەوە لە بابەتەکەی، بەرئەنجامی وەڵامێکی دیاریکراوە بۆ پرسی زانین. بۆ نموونە، بەلای هەندێک لە ئیپستیمۆلۆگەکانەووە ماتماتیک زمانێکی گونجاوە کە بەهۆیەوە زانینمان هەبێت لەبارەی سروشت، لەبەر ئەوەی ماتماتیک بە زمانێکی ئەبستراکتی دڵنیا بەخش دادەنێن و وای دەبینن کە کە گونجاوییەک هەیە لەنێوان سروشت (Nature) و ماتماتیکدا. بەڵام بەلای هەندێکی دیکەوە ئەم وتەیە هەڵگری کۆمەڵێک پێشگریمانەیە کە هێشتا وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی نەداروەتەوە؛ کێ دەڵێت خودی سروشت مامەڵەیەکی ئەبستراکت دەکات تاوەک ئێمە بە بەکارهێنانی زمانێکی ئەبستراکت لێی بکۆڵینەوە؟ بەواتایەکی تر؛ لە سەرەتاوە بەچیدا زانیمان کە سروشت ئەبستراکتە؟ ئایا هەر دوو شتێک کە گونجاوی هەبێت لە نێوانیاندا مانای ئەوەیە کە هەمان سروشتیان هەیە یاخود پەیوەندییان هەیە بەیەکەوە؟ تایبەتتر؛ هەر لەبەر ئەوەی گونجاوی هەیە لەنێوان سروشت و ماتماتیکدا، ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە ماتماتیک ئەو زمانەیە کە سروشت پێی دەدوێت یاخود ئەوەی کە سروشت ماتماتیکییە؟ ئەمانە کۆمەڵێ پرسی ئیپیستمۆلۆژین کە بناغەی زانستەکانیان لەسەر بنیات نراوە و داڕێژەرەوەی بونیادی تێڕوانینەکانی مرۆڤ لەسەر چەمکی زانست.

### سۆسەکردن (حدس – Intuition) چییە؟

– درککردنێکی هەنوکەییە بە چەمکێک یان ڕاستی گریمانەیەک. بۆ نموونە درککردن بە تێپەڕینی کات و نەتوانایی وەسفکردنی خوا بە سۆسە دانراوە.

(Simon Blackburn, The Oxford Dictionary of Philosophy, 1996, P: 197)

*****

– زانینی گریمانەیەک، چەمکێک یاخود هەبوویەکە، کە لەڕێی ئەنجامگیرییەوە بەدەست نەهاتووە. هەروەها بەرمەبنای پێشگریمانەیەک یاخود یادەوەرییەک دروست نەبووە.

(Robert Audi, The Camridge Dictionary of Philosophy, 1999, P: 442)

